# ئەو دەمەی خوێ بۆگەن دەکات

شانۆنامەنووسی پاکستانی

**ئەسغەر نەدیم سەید**

وەرگێڕان: زیاد ئەسعەد

دەڵێن مرۆڤ هەر چەندە ناسراویش بێت، دیسان لە زۆر شوێنی ئەم دنیایەدا زۆر کەس هەن نە بیناسن، نە تەنانەت ناویشیان بیستبێت. من ئەسغەر نەدیم سەید، مامۆستایەکی زانکۆ لە وڵاتی پاکستان .

زانیمەوە خانەنشین کراوم. مابووم خانەنشین بکرێم. بەر لە وادەدە بەرەو ماڵیان کردمەوە. بە دڵێکی خۆش و دەروونێکی شادەوە دەڵێم: دەریان کردم! ئاخر ئەوەی دەمویست بیڵێمەوە، ڕێیان نەدەدا بیڵێمەوە. وایان بە بەرژەوەند دەزانی کە ئیدی دەرس نەڵێمەوە. هاوکارەکانم، مامۆستایانی زانکۆ، چاوچنۆکی و ئیرەیی، هەموو بەهایەکی مرۆییی لە بیر بردوونەوە. ئەو ماوەیەی دوایی وای لێ هاتبوو خوێندکارە زەینشووراوەکانیان لێ هان دەدام. ئەو خوێندکارانە کە مێشکیان شۆراوەتەوە، بە دنەی ئەو مامۆستایانە کە بە لێستنەوەی پێڵاوی گەورەکانیان ـ لە زانکۆیان ـ شوێنی خەڵکی زانا و دڵسۆزیان گرتووە، دژی من هەڵدەسووڕان. دەمێک بوو بەبێدەنگی لەو دۆخ و بارە دژوارە ڕادەمام و هێدی هێدی خۆم دەخواردەوە.

بانگێشتنامە بۆ بەشداری لە کۆڕبەندی زانستیی زانستگەی وڵاتانی دەرەوە نەما. وای لێ هات نامیلکە لە دژی مامۆستایانی وەک من دەربکرێت. دەمدی ئەوانەی بە فندوفێڵ و ناڕەوا پلەی زانستییان بەرز دەکرێتەوە، خەڵاتی باشترین مامۆستایان دەدرێتێ. دەمدی، ئێستەش دەبینم، لە جیاتی دەرسگوتنەوە و پابەندی بە ئەرک و دەوام، لە دەرەوە خەریکی گوتنەوەی دەرسی تایبەتی و کێشانەوەی پارە لە گیرفانی خوێندکارانن. ڕاگر و ماگر بە توێژینەوەی ساختەی مامۆستایانیان خۆیان شاگەشکە پێشان دەدا. دژمنی ئیمانت بێت! وای لێ هاتووە کەوتن بە سەرکەوتن دەفرۆشنەوە. کە دەمدی بە ناوی پێشکەوتن خەریکن وڵاتەکەمان وەپاشتر دەخەن، دڵم پڕ دەبوو. دەمی هەر کێهانم دەکردەوە، پاساویان بۆ خوێڕیەتی و بێبارییی دەسەڵاتدار و کاربەدەستان دەهێنایەوە. ئەو لێبانلێسانە لە بەردەم کاربەدەست و دەسەڵاتداراندا زۆر بچووک و سووکوچرووک دەردەکەوتن. مێچکەمێچکە و کوسکێشییان لە بەردەم ئەوانەی سەرووی خۆیان کە هەموویان لە یەک قوماشن، دیمەنی پاشەڕۆژی وڵاتیان دێنامە بەر چاو. ئای چ دیمەنێکی بەترس.. چەندە گران لەسەر دەروونم!

خۆپەرستی و تەسکبینی شوێنی خۆنەویستی و ڕوونبینینیان گرتووەتەوە. دەمێکە پیلانگێڕی یەکەیەکە دڵسۆزان دەردەپەڕێنێت. وەرە ئەو گاڵتەجارییەی زانکۆیان ببینە و شەق مەبە! وەرە دەرس لەسەر ئەو سەرچاوانە بڵێوە و سووریش بزانە ناوەرۆکی ئەو شتانە بۆ ڕزگاری لە دواکەوتوویی و نەزانی، شتێک بە شتێکت بۆ ناکەن. قیڕی سیا! ڕەگەڵ کەوە و گوێی مەدەیە! با لە کاروان دوا نەکەوی.

ئەوەی دەمدی، زانکۆ شوێنی لەباربردنی مرۆڤ بوو.

ئەوەی دەمویست بیڵێمەوە، نەیاندەهێشت بیڵێمەوە. ئەوان مانەوە و بەرژەوەندیی خۆیان لە چاوی داخراو و گوێچکەی کەڕ و زمانی نەگەڕاوی خوێندکارانی وڵاتەکەم دەزانی. خوا هەڵناگرێ، لەوەدا زۆر چاکی بۆ چووبوون.

ئەمڕۆ دەمەوێت ڕاستی بڵێم، دەمەوێت پێی لێ بنێم کە خوێندکارەکانمان ئیدی بوونەتە مامۆستا، بژیشک، ئەندازیار، بانکەوان، بەڵام زۆر بەداخەوە، نامرۆڤایەتی و گەندەڵیی ئێمە بەخراپی لەواندا ڕەگاژۆ بووە. هەستی دەروونی پەستی خۆمان بەڕوونی لەواندا دەبینمەوە. قەدەرێ دی، شەش ڕۆژان لە نەخۆشخانە مامەوە. وەختێ لەوێ دەچوومە دەرێ سەرم سووڕما. لە پەتە (وصل) نووسرابوو شەش سەد هەزار ڕوپیە. گوتم ئەمە چییە؟ چ خێرە؟ ماڵی حەمە قەدۆی موسریێیە؟ یەکێک لە کۆنە خوێندکارەکانمان لەوێ بوو؛ گوتی: «مامۆستای بەڕێز، ئێمە ئەوە لە دەرسی جەنابتان فێر بووین چۆن مافی خۆمان بسێنین!»

پاشان کە چوومە بەشی ڕەگۆگرافی، کۆنەخوێندکار هات، چرپاندی بە گوێمدا: "ئەگەر لە حکوومی دەیکەیت، دەبێت چاوەڕێ بکەیت. دیار نییە کەی نۆرەت دەگاتێ. ئەگەر لە تایبەت، لەسەر گیرفانی خۆت دەیکەیت، وەرە، نۆرە و مۆرەی ناوێ؛ دە خولەکی دی لە خزمەتدا دەبین. گوتم هەو! ئەم گاڵتەجاڕییە چییە؟ گوتی: «دەستەگوڵی ئێوەیە! بۆ سکاڵاکاری درەنگە.»

خزمێکمان ئەو ڕۆژە کارێکی تایبەتی هاتبووە پێشێ. دەبوو بۆ دیتنێک نۆرە بگرێت. چەندی تەلەفۆنمان بۆ کارمەندی نووسینگە کرد، وەرامی نەبوو. بێنەکی خۆش چاوەڕێ بووین هەتا تەلەفۆن وەری گرت. خزم گوتی زۆر بەتالوکەین، نۆرەمان بۆ بێنە پێشێ ــ بە پێشنیاری بەرتیلەوە ــ کارمەندەکە گوتی، «نابێت! ئەم کارە بە هیچ کلۆجێک ڕێی تێ ناچێت. من چەند ساڵە پێوەم خۆم لەو ژارە خاوێن بکەمەوە کە بە منداڵی و هەرزەکاری بە ناوی خوێندن دە جەوهەری بوونم کراوە، تازە خەریکە دەبمەوە بە مرۆڤ! فەرموون! ئێوەیش سایری ئەو خەڵکە نۆرە بگرن و چاوەڕێ بکەن.»

پێرێ چەند سەعاتان کارەبای ماڵێمان نەبوو. هەستام چوومە فەرمانگەی کارەبا. پرتەوبۆڵەم بوو ئەو دەمەی کارمەندێک بەبێوازییەوە پێی گوتم، «مامۆستا گیان، ئەم قوڕە هەر ئەوەندە تۆزەی لێ هەڵدەستێ! چتان نەچاند بیدروونەوە. چۆنتان هێناوە، هەر وا ڕای کێشن!»

ئێستا بەتەواوی دەزانم کە منیش دەستم لە پەروەردەی سەقەتی ئەو نەوەیەدا هەیە. خۆم بە بەرپرس دەزانم لە لەبارچوونی بەهرە و هونەری سرشتیی ئەو هەموو گەنجە کە هەندێکیان هەر دەڵێی چرای کوژاوەن و هەندێکیشیان شەڕانی و تونداژۆ و ئاڵۆز.

خوێندەواران فێرە تەسکەبیری و خۆپەرستی بوون، خۆمان بزانین! کۆمەڵ بیری توندڕەوی تێیدا باوی سەند، خۆمان بزانین!

دەمارگرژ و کۆنەپەرستانی وڵات نهێنبڕانە هەڵدەسووڕان ئەو دەمەی ئێمە بە کۆکردنەوەی خاڵی چالاکی و بەرزکردنەوەی پلەی زانستی و شکاندنی ملی یەکتری خەریک بووین. ئەو دەمەی توندڕەوەکان مێشکی گەنجانیان دەشووشتەوە، ئێمە حەفتوهەشتی سەرەمووچەمان بوو. تیرۆریستان گەرایان دادەنا، ئێمە خەریکی ڕقەبەرایەتیی یەکدی بووین. خۆمان بووین، کەس نەبوو. خۆمان بە خۆمانمان کرد. ئەمڕۆ کە خۆکوژێک دڵی کوێر دەکات و چاوان دەبەستێت، دەچێت ماڵی خەڵک وێران دەکات، ئێمەش لە تاوانی وی بەشدارین. کە خوێندکارێک دوای تەواوکردنی خوێندنی، دەچێت ناموسڵمانێک دەچەوسێنێتەوە، کە لە موسڵمانی لە ڕێبازی جیاوازی هەڕەشەی کوشتن دەکات، ئێمەش تێدا هەین ـ بەشدارین.

ئەمڕۆ ڕاست دەڕۆم و دەڵێم دەبوو چی بە خوێندکارانم بڵێمەوە. من دەمویست ئەو شتانەیان پێ بڵێمەوە کە لە کتێبەکانی فەلسەفەی هونەر و ئێستاتیکادا هەن و ئەوان لێی بارنج کراون. دەمویست پێیان بڵێم کە بەبێ هەستی جوانیناسی، گوتنی "سوبحانەڵڵا، سوبحانەڵڵا" خەمێکیان چار ناکات. دەمویست دەرسی جوگرافی بکەم بە سیباری و هەموان بیخوێنن، ئاخر جوگرافیا جەوهەر و ماکی بوون (وجوود) و کرۆکی ئەم سرشتەش بە مرۆڤ دەناسێنێت ــ جوگرافیا بە خۆی و خاکەکانی، جوگرافیا بە خۆی و وەرزەکانی، بە خۆی و جەنگەڵ و ڕووبارەکانی، بە خۆی و ژیانی زەریاکانی، بە خۆی و نفش و نەوەکانی کە من زۆر بەتاسووقی ناسین و ناساندنیان بووم. دەمویست مرۆڤەکانی هاووڵاتم و گیاندارانی ئەم خاکوئاوە ئاشت بکەمەوە. نە هێشتیان من لەو مژارانە بدوێم، نە خۆیشیان کردیان و دەیکەن. دەمویست پێیان بڵێم کە هیچ زانکۆیەکی ئەم وڵاتە ناگاتەوە بە کەناڵی ناشناڵ جوگرافی (National Geography) – ڕێ نەبوو بیڵێم.

دەمویست ئەو مێژووە بڵێمەوە کە خۆمان ناسیومانە و بە وردینە زانیومانە، نە ئەو مێژووەی خەڵکی دی بۆیان داناوین. دەمویست مێژووی چەواشەی وڵاتەکەم بناسێنم. ئەوان دەیانگوت نا، ها ئەو مێژووە بڵێرەوە کە سوور دەمزانی هیچی بەسەر هیچەوە نییە و دڕندەی خوێنمژی مرۆڤی بە فریشتەی پاک و بێگەرد ناسێنراون. نەیاندەهێشت زمانمان لەو کەسانە بگەڕێت کە مێژووی ئەم وڵاتەیان شێواندووە. ئەو کەسانەی وێنەیەکی ناتەواوی وڵاتیان لە زەینی گەنج و لاوان کێشاوەتەوە و وڵاتپەرستییان کردووە بە نەنگ و عار، نابێت لە گوڵ کاڵتریان پێ بڵێین! نابێت نە بە چاک و نە بە خراپ باسی ئەوانە بکەیت کە ڕۆژنامەنووسان دەچەوسێننەوە، کە نووسەر و ڕۆشنبیران دەکڕن، کە دڵسۆزانی وڵات ڕەشکوژ دەکەن. دەمویست بە نەوەی دواڕۆژ بڵێم ئەوانە کێن. دەمویست بڵێم

ئەوانەی مافی مرۆڤ پێشێل دەکەن، ئەوانەی زۆر لە بێزۆران دەکەن، ها ئەوانەن بیانناسنەوە. ڕەنگە وا بزانن هەر منم بێدەنگ کراوم؛ نا، هەرکێ خاوەن دەنگی خۆیەتی، کپ کراوە.

یۆژێن یونێسکۆ شانۆنامەیەکی هەیە بە ناوی «کورسییەکان»؛ لەوێدا ئەفسەرێکی خانەنشین سەرجەم ئەفسەرە پلەبالاکانی وڵات بانگێشت دەکات. کە یەک یەک بەرەو ئەوێ دێن، خانەخوێ لەگەڵ کورسییەکانیان قسە دەکات و بەوانیش دەڵێت، «کاکی براینە، ئێوە خۆتان هیچ نین. ئێوە کورسییەکانتانن. لەم سیستەمەدا ئێوە بێناسنامەن. کورسین و بەس.» منیش دەمەوێت هەرچی بە پلە گەورە و باڵای وڵاتە بانگێشت بکەم و پێیان بێژم، کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە. بەڵام منیش، لە ئێوارەیەکی وادا، دیوار دەدوێنم هەتا دار وتەم تێ بگات. منیش دەبێت هەر کورسییەکان بدوێنم.

تەواو.